# ئێواره ئاشقه‌كانی ته‌مه‌ن

**فه‌وزیه سوڵتان به‌گی**
**رووبه‌رگ: ئاسۆ مام زاده**
**ناشر: پیام امروز ـ تاران**
**چاپی یه‌که‌م ۱۳۸۲**
**ئه‌ژمار: ۵۰۰ به‌رگ**
**پیتچن: محه‌مه‌دئه‌مین شاسه‌نه‌م ﴿٦٢٢١٣٤٠ بۆكان﴾**
**چاپ و صحافی: امینی ـ تاران**
**شابک: ۹۶۴-۵۷۰۶-۲۸-۱**

---

نشر پیام امروز: تهران، خیابان انقلاب، خیابان فخررازی، بعد از لبافی‌نژاد،
شماره ١١١، تلفن ٦٤٩١٨٨٧

# پێرست

## ترس

هیچ کاتێ ناوێرم
دەلاقەی چاوەکانم
بەرەو ئاسمانی ژیان ئاواڵەکەم
ئەترسم نەکا رەشەبا
تارای سەر رازەکانم لادا و
لەم جیهانە مەسخ کراوە دا
بیاندرکێنێ

ئەوسا کوڕە قەرەجێک
بێت و بمبات
بۆ پاروە نانێک
شار بە شار و دێ بە دێ
دەستم بگرێ و
هەڵمپەڕێنێ.

خەزەڵوەری ٧٥

## چەشنی خەونێکی سەر لێ شێواو

لە مێژ ساڵە
لە باغچەی حەوشەکەماندا
گەڵا وەریوەکانی پاییز
قەتیس ماون !
هیچ درەختێک
داڵدەی ئەم پەرەسێلکە هەڵکورماوەی
رۆحم نادا.

چەشنی خەونێکی سەرلێ شێواو
ئارام ناگرم
لە تویێی هیچ هەناسەیەکدا
ئەڕۆم ...
ئەڕۆم
لە حەسرەت ماچێکی دەریا
ئەبم بە دڵۆپێک فرمێسک و
ئەتکێمە داوێنی دایکمەوە

لە مێژساڵە
لە جەغزی ئەم مێژوە تەماویەمدا
بەژانی عەشقێکەوە
ئەتلێمەوە
باڵی ئۆقرەم هەڵوەری
ئەی شەپۆلە هەڵچوەکانی
گڕکانی سەرم
کەی ئەمگەیەننە
بەردەژانەکەی مریەمی مەسیح .!!

١٣٧٥

## بووکە بارانە

دڵدارێکم سەر لێ شێواو
لە داوێنی چیای عەشقا
لە ناو تەمی یاسادا قەتیس .
تاوێک
جەستەی زامەکانی خاتوزین دەشۆمەوە
دەمێک
لێزگەی فرمێسکەکانی خەج دەهۆنمەوە

تاوێکیش دەبمە بڵێسەی ئاگرێکی یاخی و
دەچمە دەمارەکانی مێژووە .

باڵدارێکم بێ ئاسمان
لە گەڵ ئاوازی شێعرەکانتا رەنگم گرتوەو
بەرەو گەرمیانی سینگت هاتووم
دەلێم گەڕێ !
ئاگرە سوورەی ئەوینی زلێخا
داوێنی دڵی گرتووم

لەم ویشکەساڵی مێهرەبانیەدا
بووکە بارانەی
دست منالێکی گرەزۆکم
لەبەر رەشمالی هەر هەوارێک
هاوار دەکەم:
بارانم دەوێ....
با...
را...
ن

. . .

بۆ وەی
چۆلەکەی سۆزەکانمان
رەنگی برسێتی نەبینن
دەچم ...
لە بوخچە رازەکەی سینگی دایکم
چەپک ،چەپک
ئاوازیان بۆ دەهێنم .

## گومان

گومان ژنە قەرەجێکە فاڵگر
هەموو رۆژێ
لە ئاستانەی چارەنووسم دا
چۆک دائەداو دەڵێ :
دەی دەستەکانت بێنە با . . . .

زۆر دەترسم ئەم گومانە نەفرەتاوییە
سەری دوا رۆژمان بخوا و
لە جواناوی هەناسەکاندا
بمانخنکێنێ !!

## ئەو دیو سنووری پەنجەکانم

لە گوێ ئاگردانی دڵم دا
سەرم بەستی و
وشە پەپوولەییەکانی شێعرم
بوونە بەرد.

ـ بەسە چی تر دامەچڵەکێنە!
ئەم پەپوولە شەهیدەی گڕی ئەوینت!
بە ئەفسانەی سامناکی لێکدابڕان

من ئەستێرەی یاخی ئاسمانی شەوم
هاتووم
لەگەڵ جریوەی بەیاندا
هێلانە بکەم لە ئاسمانی گیانتا
هاتووم بەفر ئەگەر ئازاری رۆحت بێ
چی بەفری چیا و کوێستانە بیخۆمەوە
لە پشکۆی هەناسەیەکدا

بێدەنگی ئەگەر عەزابی گیانتە
ببمە لاوژەی ئەوین
بەسەر چڵی سەوزی گوڵە ماچێکەوە

بۆ کوێ دەڕۆی ؟!
کام جیهان
وەک شەقامە کریستاڵیەکانی رۆحم
ئامێز دەگرێتەوە
بۆ غەریبی هەنگاوت !؟

له مێژووی هەزارویەک کارەساتەوە
هاتووم
له رۆشنایی چاوەکانتا
مێژووی چیرۆکەکانی
بەر له هەزارویەک شەو بسووتێنم

وەرە باوەشی خەمە پیرۆزەکانم
خەونی خودا و بەهەشت و
سەربەستی لێ دەبارێ
بۆ کوێ دەچی؟!
ئەو دیو سنووری پەنجەکانم
ئاسمان لێڵە و بەرد ئەبارێ
بەرد ئەباری

بۆکان ـ ١٣٧٦

# غەریبی

سەرم
گۆمی هەزار حەزی تاساوە و
مەلی دەنگ خنکاوی ئەندێشەمە
شێتانە سەر لە تاشەبەردی
ئاسمان ئەکوتێ
مخابن پەنجەی بریسکەیەک
سامی تەنیاییم ڕانامالێت !

وا ئەم ئێوارەش ئاسمان
لەسەر شانی هەورێکی دڵ شکاو
بەنیازی خەونی باران
چاوی لێک نا
منیش حەیرانی
بەژنی چناری موسافیرێکم
لە نیشتمانی لێڵی چاوەڕوانیمدا

غەریبیت دەکەم !
ئەی شێعرە کۆیلەکەی دیوانی برسێتی!
هەمو جەستەی داپۆشیم غەریبیت
عەتری هەناسەت نەبێ
بارانی هیچ گریانێک نامشواتەوە
چاوەروانیت
ئاشنای
رێگەی کۆچی کردم

هەڵوەریم و
هەر نەگەییشتم بە وەرزی هاتنەوەی تۆ

لە ئەقیانووسی ئاوارەییدا
گێژ دەخۆم و
بەندەرەکان *نامۆن بە رۆحم*
باوەشتم بۆ بکە بە کەنار
تەنیا چرای دڵت دەناسێ
ئەم پەپوولە سەر گەردانەی وەرزی فڕینت.

## هاوارە لە من

هێندە لە گێژی گەردوونا
گێژم خوارد
هەموو ساتە سەوزەکانی خۆزگەم هەڵوەرین
بۆ وەی گوڵەکانی خیانەت
رەنگ زەرد نەبن
دڵۆپ دڵۆپ نمە بارانی چاوەکانم هەڵدەمژێ
قاقڕێکی پڕ لە سەراب

چ خۆشبەختن ئەو باڵندەکۆچەریانەی
لە سەوزایی ئەبەدییەتدا
ئاوا دەبن و
نەفرەتی زەوی نایانگاتێ

لەم جیهانە پرغوربەتەدا
ڕێگەی دووری ئەندێشەم
چڵی زەردی دارسێوە کرمۆڵە یە
وا فریشتەکانی سەرم
نەزانانە سوجدەی بۆ دەبەن
گەر هەنگاوێ دوورتر بفڕم
ئەگەمە وەرزی رەشی گەردەلوولی تاوان

مردم ئەوەندە
لە گێژەڵووکەی نەدامەتیدا
بووم بە دەسرۆکەی سەمای جندۆکان

مردم ئەوەندە زیکری ساتە مەیوەکانم کرد
لە بەرزەخی سامناکی چاوەڕوانیدا

سەدان ساڵە لە دوایین جاری مردنم
تێپەڕ دەبێ
کەچی نەحەشرم دەکەن
نە لەم گۆڕیچە تەنگەش دەرم دێنن

ئاخۆ کەنگێ
ئایەی حەقیقەت نازڵ دەبێ !؟
کام پێغەمبەر ...
کام ئۆمەت وەری دەگرێ

ئاخ پەپوولە قژ ئاگرینەکە
ئەوە تۆ بووی یامن؟!
لە پێناو ئەوینێکی ئەفسانەییدا

چی تاشە بەردی ئاسمانە
باری بەسەرماندا ؟
ئەی بۆ نەمردین؟!
تۆ بڵــێی مەرگ بە هێزتر بێ یا ژیان ؟
بەرد سەختتر بێ یا گیان؟

یا ئەوینی وڵات دامان ئەگیرسێنێ
بە پشکۆی پیرۆزی رقی تۆڵە

ئەی ئەو خاتوونە دیلەی چوارمێخەیان کێشاوی
لە جوگرافیای تاوانێکی پیرۆزدا
چەپکێ بۆکڕووزی سینگت
بکە تێشوی ڕێگام
ئاسمان ژەنگاوی و
پێغەمبەرەکان خائینن
ئایەکان بە پیرۆزی ناگەنەدەستمان

٧٦/ ٦/٢١

## یەکەم کەس

یەکەم کەس بووم
رازی ئاسمان و نەهێنی بارانم
بۆ پەنجەرە داخراوەکان درکاند
یەکەم کەس بووم
لە پەرستگەیەکی پڕخوادا
کڕنۆشم بۆ زاتی خۆم برد و
کۆترەکانی ناخم
بوون بە ژێر هەرەسی تاوانەوە

تاوانم کرد !
تاسەی دارستانێکی بێ بەهار ـم
لە سەوزایی خوێنی گوناهەکانم دا شوت
لە دۆزەخی ئەم تاوانەدا دەسووتێم
بێ گۆناهتر لە فرمێسکی گوڵەبەفر
تینووتر لە سەرابی عەشق

دەسووتێم
شەیداتر لە وشەی نامە بێئادرەسەکان
لەسەفەری جادە تەنگەکانی رووناکیدا

یەکەم کەس بووم
نائومێدی باڵی لە رۆحم وەرداو
پەنجە بۆشەکانی مەرگم زیارەت کرد

زستانی ١٣٧٦

## خەون نابینم

خەون نابینم
چیتر لەگەڵ بێ قەراری ئێوارە نارنجیەکان
سەفەری وڵاتی باران ناکەم

تینووترم لەوەی
بارانی وەرزی ئەم گریانە تەڕم کات
تەزیوترم لەوەی دامگێرسێنێت
بریسکەی یادی ئەو بەهارەی
هەرگیز نایات

ئیتر خەون نابینم
چیتر لەگەڵ بێ دەنگی وشە خامۆشەکان
دڵداری ناکەم
هەرگیز نامگەیەننە زریکەی رۆحم
هەنگاوی خەواڵووی ئەندێشەم

لەپرسەی ئاوازە بێلانەکاندا
ئاسمان سەری هەڵگرت
منیش بوومە غوربەت نشینی
ئەم وڵاتی رەشەبایە

رۆژ نییە نەمدزن
کوڵانە بونبەستەکانی ئاشنایی و
لە تراویلکەی شێعرێکدا نەخنکێم

ئیتر ناخەوم
چیتر خەون نابینم

تادەڕۆم
دوورتر دەبم لە رۆحی خۆم
نامۆتر دەبم بە بەهار
بە گوڵ
بە باران
نامۆتر دەبم
بە نەهێنی
جادە پڕ جریوەکانی کاروان!

٧٦/١٢/٨

## تاسە

لەو ئێوارەوەی
ڕۆحی کێڵگە پاییزیەکان و
هەناسەی باڵداری کۆچ ئاوێتە بوون
تەزووی زستانێک هەژاندوومی
سێحری وشە عەشقاوێکانیش
ژیرم ناکەنەوە ئیتر

قژەکانی هەموو وەراندم
سەختەڕێی ئەم سەفەرە
سەرم بە شوێن هاواری قژەکانمدا
خەریکە دەگاتە
زستانی پڕ کارەساتی سڕ بوون
خەریکە دەبێتە دارستانێکی وێل
بە شوێن جریوەی باڵندە تەریوەکاندا

وتیان بەهەشتی خەونەکانتە
ئەودیو سنووری نیگا تەسکەکانت
ئەتبەن لەسەر شانی هەورەکان
هێلانەیەکت بۆ سازدەکەن لە باران
ئەتبەن باڵی رەنگینی پەلکە زێرینە و
سێحری پیتەکانی بێدەنگیت
بۆ دەستەمۆ دەکەن

بردیانم
لە رۆخی دەریا ئاوێنەییەکاندا
بوومە دەستەخوشکی حەسرەتی گوڵە نێرگز
لێرە دەستم ناگاتە باڵای ئاوارەییم
بەفری غەریبی لە شان داتەکێنم

ئێرە وڵاتی جندۆکانە
ئێوارێ و بەیانی
دەست دەوەشێنن لەرۆحی جوانەمەرگم
شێتم دەکەن
شێت!

لە داوێنی ئەم عەشقە کۆیلەدا
نە باڵەکانم چرۆ دەکەن
نە هەناسەکانم دەگیرسێنەوە
لەسەر روومەتی ئاڵی گوڵە خەونێک

ئێوارێ و بەیانی
تێکەڵ ڕۆحی پەپوولە بابردوەکانم دەکا
تاسەی وڵاتی سەربەستی قەرەج

بۆکان ١٣٧٦

## تکا

لەو ئاسمانەی
هەزاران جار باڵندەی بێ سەر
تێیدا دەفڕن
پەڵە هەورێکی سەرگەردانم
رۆژێ هەزاران جار
لەگەڵ مەرگی خۆم دا
دا
دە
با
رم

خۆ مەدەنە بەر بارانی ئەم مەرگە غەریبەم
نەکا چەتری نەهێنیەکانتان بسووتێ
نەکا لە دۆزەخی گوناهەکانتاندا
ببنە دووکەڵ و
نەتان بینمەوە ئیتر .

## ماڵئاوایی

هەرچی رۆژە شیعرێک
هەرچی رۆژە عەشقێک دەمرێت
لە وڵاتی بێ نەخشەی رۆحمدا

لافاوێک
لەگەڵ شەهیدەکانی گۆڕستانی گیانم دەمرفێنێ و
نازانم
لرفەی کام شەپۆلی لێڵ رامدەپێچێ؟

نامبیننەوە ئیتر
نە لە وێستگە کوتوپڕەکانی ئاشنایی دا و
نە لە شەقامی ئەرخەوانی شێعر و
نە لە حەرەمی باڵە پیرۆزەکانی ئەوین دا

رەنگە دەرفەت نەبێت
ئاوڕێکی بڕیارە تاساوەکان
بدەمەوە و بڵێم :
ماڵئاوا !
ئەی ئەو گوڵدانە پێکەنینانەی
لە تاریکستانی وەهم دا ون بوون
ماڵئاوا !
ماڵئاوا ئەی ئەو کۆترە بەهەشتیەی
لە جۆگەلەی خوێن و
بۆ کڕوزی قژ و
تەرمی پەنجەکانمدا باڵت گرت و
بۆ جارێکیش سەرت نەکرد
بە ژوورە بێ بەهارەکەی دایکمدا

مالئاوا
خودا خەواڵوەکانی حکوومەتی جەستەم
رەنگە دەرفەت نەبێ جارێکی تر
بە پەیژەی گوناهە نەکردوەکانی حەوادا
بمبەنەوە زیارەتی
یەکەم پیتی دەرسەکانی گومڕابوون!

١٣٧٧

## ئێواره عاشقەکانی تەمەن لە دوورگەی گوماندا

خۆر لە تەنیاترین چرکەی تەمەندا
جێم دەهێڵێت
پەنجەرەکان نامۆن
نامکەنە میوانی ساتە خەونێکی خودا

ئێوارەیە !
سەمفۆنیایی ئەم غوربەتە
ئاسمانی رۆحم دەڕووشێنێ و
شکۆفەی هەزاران گوڵەزام
لە بیابانی دڵمدا
دەکەونە سەما

ئێوارەیە
کۆچی باڵندە خامۆشەکان بە ئاسمانی حەوشەکەماندا
عەشقە بێ هێلانەکەی خۆمم و
سەفەرە بێ گەڕانەوەکەی دایکم و
برژانگی قرتاوی نەورەسەکانم بیر دەخاتەوە
چ تاریکە شەقامی ئەم مێژوە تاڵەم

من هەمیشە
تەرمی بەر لە دایک بوونی خۆم لە سەر شانە و
دۆزەخ بە دۆزەخ
بۆ دەفتەری خەونە دووکەڵاویەکانی
مێژووی دەخوێنمەوە

حەسرەتی تریفە سەرابیەکان
پەڕەوازەی ئەم دوورگەی گومانەی کردم
گومان بوو بە یەکەم منداڵی خەباتم و
هەموو رۆژێ
بەردبارانی ئەو تروسکە ئاوێنەییانە دەکات وا
به ژووری بێ قەراری رۆحمدا هەڵمواسیون

دیوێکم گومان
دیوێکم عەشق
بە کەنارە لماوییەکانی زەماندا
رادەکەم و ناگەم بە تۆ

گومانم هەیە لە دڵۆڤانی رێگا و
گەڕانەوەی شەهیدەکان
گومانم هەیە بێ تۆ
سکاڵام بگاتە ئاسمان و
ئەم بارانە گریانەم خۆش کاتەوە

ئێوارەیە
تەمەن لە پەنجەی بێزاریدا
خەریکە دەبێتە خەڵووز
نە من بوومە عەشق و
نە گومان بوو بە ئارامگەی من

حەز دەکەم
یەخەی شەو داتەکێنم لە بێدەنگی
تاوێک گوێ بگرمە هاژەی ئەو ئاوازانەی
لە دەریای نیگەرانیدا
دێن و دەچن

حەز دەکەم
پیاسەیەکی ئەزەلیترین وشە
ئەزەلیترین باران
ئەزەلیترین بەندەری خۆشەویستی بکەم

بۆکان ١٣٧٦

## سەفەر

ئێوارەیەک لەگەڵ
کەژاوەی پەپوولە سەرهەڵگرتوەکانی شارەکەم
دەکەومەڕێ
هەموو ئەو ئاوێنە تەماویانەی
لێڵم دەکەن و
ئەو دارستانە ڕووتەی لە سێبەری دا خنکام
بە جێ دێڵم

بەشی خەزانی خۆزگەم ناکات ؛
کۆشی نارنجی ئەم پاییزە
دەبێ بە وەرزێکی دی و
بە ڕەنگی ئەبەدی بسپێرم
دوایین گەڵای وەریوی ئەم عەشقەم

ئێوارەیەک یەخەم
لە بێ هوودەیی چرکە زەلیلەکانی زەمان
دادەتەکێنم
حاشا لەو پێکەنینە ژەهراوییەی
تەمەن مەسمووم دەکات

حاشا لەو بەهارەی تەنیایی گوڵدان و
برینی باخچەی سارێژ نەکرد

حاشا ...
حاشا لەو بەهەشتەی بیری مردووی لێ سوڵتانە!

ڕۆحم لە ژێر تەرمی
ڕۆژە کوژراوەکاندا بۆنی گرت
پەنجە لەرزۆکەکانی مەرگیش
ناتوانن ڕزگارم کەن
ئاخ!
کچە تاقانەکەی دایکم !
چەندە لە پەرستگەکاندا نوێژمان کرد و
بارانێک تەڕی نەکردین

چەندە تەرمی وشە ترۆرکراوەکانمان
لە گۆڕستانی گیانمان دا هەڵگرت و
شیعرێک نەتەقیەوە
بە رووی تاریکیدا،
چەندە لە تەوافی پەلکەزێڕینەدا مردین

دەچمە خەڵوەتی ئەو باڵندانەی
لە فیراقی ئاسماندا
زیکر دەکەن
دەچمە سڵاوی ئەو ڕێچکانەی
پەڕینەوە لە سنووری زام و برین

سڵاوتان لێ بێت
ئەی ئەو شیعرانەی
لە جەژنی
سووتانمدا لە دایک دەبن

سڵاوتان لێبێت
باڵە سەبوورەکانی عەشق !
کەی باڵای پیری ئەم زستانە هەرەس دێنێ و
دەمگەیەننەوە برایمۆکی خەونەکانم ؟

نوقمی بەستەڵەکی سەفەرم و
وێستگە ئاوارەکانی غوربەت چاوەڕوانمن

تا چاو هەتەر دەکات
رەهێڵەی تاریکی
تا گوێ بڕ دەکات
لوورەی شەقام

تا ئاسمان هەڵدەگرێ
تەرزەی تانە

منم و
ویزای حەسرەت و
جانتایەک پڕ لە ژان !

سەرماوەزی ٧٧

## بێدەنگی

بەرۆژ
هیلاکی شەقامە بە ساڵاچوەکانی
خەونێکی کۆنم
شەویش
لەژێرهەنگاوی هەناسە ژانگرتوەکانی شـێعرێکدا
ئەبم بە چرۆی زامێک و
لە توێی رۆحی خۆما
سەر دەنێمەوە

لەم نیشتمانە دزراوەدا
هەر چەند ئەکەم
ناگەم بە تەعبیری خەونەکانم
قژم لە هەرێمی عەشقێکدا هەڵوەری
پەنجەکانیشم لە تەزووی قاقای
گەردەلوولێکی نەفرەتاویدا

وێڵ وێڵ ئاوارەی
کۆڵانە داخراوەکانی شاری تاسەم
ئیتر ئاسمانێک شک نابەم
غەریبی خۆم و
دایکم و
دڵدارەکەمی تێدا حەشار بدەم.

ئای دڵدارە دەنگ دزراوەکەم !
باڵی ئەندێشەیان بڕیم و
لە دەلاقەی سەرمەوە هاویشتیانە
سەر برینە بۆن گرتوەکانم .

قەڵەمەکەم*

کچە کۆچەرێکە رەش پۆش
هەوار، هەوار
شوێن پێی شنە رازێک هەڵدەگرێ
زرێکەی ئازاری ئەم دوایەمی
تێدا بچرێ
تۆ دەزانی ئێستە
نیشتمانی سەوزی قەڵەمەکەم
لە گوێ ئاگردانی کام بێزاریدا
دەسووتێت و هەڵدەقرچێ ؟

بۆ بێدەنگی ؟!
من لە ژوانی خوادا
چپەی ئەوینی خاک و
ئایەتی دەروونی تۆم بیست
کە دڵداری

خوا و وڵاتم لێ بدزن
ئەتۆ و رێگەی دیتنەوەی
زەریاکانیشم لێ ون دەبێ

بۆ بێدەنگی ؟!
لەم نیشتمانە زامدارە دا
هەنگاوی رێیان بڕیم
دەلاقەی نیگایان دزیم
ئیتر باغچەیەک شک نابەم
چپەکانمانی تێدا بچێنم !

**بەهاری ٧٦**

---

۞ ئێوارە ژوانێک لە گەڵ «کۆچەریانە»

بای دێ
کۆترەکانی سینگم
بە سەر شانی گریانەوە پەڕەوازەی
جوانەمەرگی دەبن
هێلانەی دەستەکانی تۆش
وێران دەبن
وێران
وەک وێرانی دڵە با ـ بردوەکەی خۆم

- چ ئاژاوەیەک هەڵیگرتوە زەمان

مینێک لە سینگما دەتەقێـتەوە و
تەنیا بۆنی باڕووت و هەناسەکانی ڕێبین
جێ دەمێنن لە وێرانی چاوەکانمدا

بمزانیبا لە پشت دەرگای تەمەنم
کەمینی گرتووە
زستان
بمزانیبا هێند بێ ڕەحمانە جێم دەهێڵێ
بەهار
بێ ئەوەی ئیزنم بدات
شەڵاڵی بەژنی بریسکەیەکی وێڵ بم
ماچەکانم هەر بەو باڵندە ئەبەدیە دا بۆ دەناردی
نە خەمی برسێتی دەزانێ و
نە ترسی ڕاوچی مەرگ

بوکان ۱۳۸۰

## دوور

له پاییزی ئەم شەوە تاریکەدا
پەڕیوەی وڵاتی سەرگەردانیە
خاتوونی رۆحم
لێڵ و تەنیا
ئەڕۆم و
بەدەم وێڵی ئەم رێگەوە
گەڵا ... گەڵا حەسرەت
دەبارێتە داوێنی ژینم
*ـ بۆکوێم دەبات ئەم شەقامە نامۆیە؟*

من قەرەجم !
لە وڵاتی بەخشەندەی ئەویندا نەبێ
بەر ناگرێ باخی دڵم
لە پێناو ئێوارە سڵاوی رێبوارە بەفراوییەکاندا ونم کرد
هەموو ئەو شەوانەی
یادەکانی دایکمیان تێدا نووسرابوو

*تاوانی من*
*داگیرساندنی گڵۆپێک بوو*
*بە داوێنی رەشی ئاسمانەوە*

ئیتر باری ... باری
لافاوی ئەستێرە هات!
چوزانم ئاوا باڵداری حەزم دەتاسێنێ
پرچی شۆڕی ئەم بارانە .

لە پێناو رەهایی وشە دیلەکاندا
چاو- م بەخشی بە شەقامە بێ کۆتاییەکانی ئینتزار

دڵ ـ یشم
بە بێ دڵترین ئاوێنەی ژوورەکەم

ئەی شەپۆلە مێهرەبانەکەی
گەردەلوولی ژینم
بمبە بۆ دوور
بمنێژە لە ژێر
سێبەری سووری مێلاقەیەک ... !

بۆکان ١٣٨٠